

٦٠٠ پرسیارو وەڵام لەسەر

# زانستی تەجوید

بۆ ئاستی پێشکەوتوان

بەریوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە لە ڕێگای (الشَّاطِبيَّة)وە


ئامادەکردن:

بنکەی هەڵەبجەی تازە

دەزگای ڕۆشنبیری نوری حیکمە/ سلێمانی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إنَّ الحمدَ لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمَّداً عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب.

أمّا بعد:

سوپاس بۆ خودای گەورە وا چەند ساڵێکە لە کوردستانی ئازیزماندا هەوڵ و کۆششێکی بەرچاو دەبینرێت لە بواری زانستەکانی قورئان، بە تایبەت لە بواری جوانخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، ئەمیش پاش فەزڵی خوای گەورە دەگەڕێتەوە بۆ لێبڕانی چەند مامۆستایەکی بەڕێز کە لە دەرەوەی هەرێمەوە ئەم زانستەیان هینایەوەو ڕۆڵەکانی ئەم میللەتەیان پێ ئاشناکرد، خوای گەورە پاداشتیان بە باشترین شێوە بداتەوە.

لەلایەکی تریشەوە زۆربەی بنکەو سەنتەرەکانی خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز یاخود هەموویان تاقیکردنەوەیەکی تیۆری بۆ فێرخوازان ئەنجامدەدەن وەك یەکێك لە مەرجەکانی مۆڵەتپێدان، بۆیە ئێمەش وەك چەند خزمەتکارێکی قورئانی پیرۆز لە برایان و خوشکانتان هەستاین بە ئامادەکردنی زیاتر لە (600) پرسیار بە شێوەی هەڵبژاردن بە ئومێدی ئەوەی سوودێکمان گەیاندبێت و کەلێنێکمان پڕ کردبێتەوە.

فێرخوازی بەڕێز، بە گرنگی دەزانین ئەوەش بڵێین کە (زانستی تەجوید) زانستێکی پڕ لە یاساو ڕێسایەو چەندین بابەت و وانە لە خۆ دەگرێت، بۆیە پێویستە لە خزمەت

ماموٚستایەکی لێهاتوو و خاوەن موٚڵەتدا بە وردی بخوێنرێت، تاوەکو زاراوەکانی ئەم زانستە ڕوونببێتەوە، گەرنا ئەم پرسیارو وەڵامانە وەك پێویست سوودیان لیٚ نابینرێت!

لە کوٚتاییدا لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە ئەم کارەمان لیٚ وەرگرێت و بیکاتە توێشووی دواڕوٚژمان، دەستخوٚشی لە هەر خوشكو برایەکیش دەکەین کە لە هەر کەمو کوڕیو هەڵەو بیرچوونێك -کە هیچ کەس لێیان بە دوور نابێت- ئاگادارمان بکاتەوە.

تێبینی: بوٚ دانانی ئەم پرسیارو وەڵامانە سوود وەرگیراوە لە کتێبی (زانستی تەجوید) لە دانانی ماموٚستا سیروان حامد، چاپی سێیەم.

سبحانك اللهمَّ وبحمدك نشهدُ أن لا إلهَ إلاّ أنت، نستغفرُك ونتوبُ إليك.

1 محرم 1438

2016/ 10/ 2

ته‌نیاحاجی

# Tanya Haji | ته‌نیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم
🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و  بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن ئازیزێکی چه‌ناڵ کراوه به دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

ئه‌کاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link



## بەشی یەکەم

## پێشەکیەکانی زانستی تەجوید

1- پێشەوا (عاصم) لە ساڵی ................ کۆچی دوایی کردووە.

| [أ] | 120 ك | [ب] | 127 ك | [ج] | 85 ك | [د] | 115 ك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

2- پێشەوا (حفص) ساڵی ................ لە دایکبووە.

| [أ] | 93 ك | [ب] | 83 ك | [ج] | 92 ك | [د] | 90 ك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

3- پێشەوا (حفص) ساڵی ................ کۆچی دوایی کردووە.

| [أ] | 180 ك | [ب] | 170 ك | [ج] | 181 ك | [د] | 182 ك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

4- سەنەدی ڕیوایەتی (حفص):

| | |
|---|---|
| [أ] | (حفص) عن (عاصم) عن (درباس) مولى ابن عباس عن (ابن عباس) عن (أبی ابن كعب وزيد بن ثابت) عن النبي (ﷺ) |
| [ب] | (حفص) عن (عاصم) عن (أبي عبدالرحمن السلمي) عن (عثمان بن عفان وعلي بن أبي طالب وعبد الله بن مسعود وأبي بن كعب وزيد بن ثابت) جميعهم عن النبي (ﷺ) |
| [ج] | (حفص) عن (عاصم) عن (مجاهد بن جبر) عن (عبدالله بن السائب) عن (عمر بن الخطاب وأبي بن كعب) عن النبي(ﷺ) |
| [د] | (حفص) عن (عاصم) عن (زر بن حبيش) عن (عثمان بن عفان وعلي بن أبي طالب وعبد الله بن مسعود) جميعهم عن النبي (ﷺ). |

5- دانەری تەجوید لە ڕووی جێبەجێکردنەوە (تطبيقي) .................... بوو.

| [أ] | پێغەمبەر (ﷺ) | [ج] | أبو الأسود الدؤلي |
|---|---|---|---|
| [ب] | هاوەڵان | [د] | أحمد الفراهيدي |

6- تەجوید لە زمانەوانیدا .............

| [أ] | چاککردن | [ب] | جوانکردن | [ج] | (أ + ب) | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

7- تەجویدی کردەیی (عملي): إخراجُ كلِّ حرفٍ مِنْ مَخرجِهِ وإعطاءُهُ ...............

| [أ] | حقَّهُ | [ب] | مُستحقَّهُ | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

8- یەکەمین کەس لە سەر زانستی تەجویدی نووسیی: .................

| [أ] | أبو عمرو الداني | [ج] | عبدالوهاب القرطبي |
|---|---|---|---|
| [ب] | مكي بن أبي طالب القيسي | [د] | أبو مزاحم الخاقاني |

9- یەکەمین نووسراوی سەربەخۆ لە سەر زانستی تەجوید بە شێوەی .......... بوو.

| [أ] | پەخشان | [ب] | هۆنراوە | [ج] | المقالة | [د] | (أ+ب) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

10- باشترین ڕێگا بۆ فێربوونی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .................

| | |
|---|---|
| [أ] | گوێگرتنی مامۆستا بۆ خوێندنی فێرخوازو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی. |
| [ب] | گوێگرتنی فێرخواز بۆ خوێندنی مامۆستا. |
| [ج] | گوێگرتن لە قورئانخوێنە بە ناوبانگەکان. |
| [د] | (أ + ب) |

11- خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە لەسەر خۆیی و هێواشی هەل دەڕەخسێنێ بۆ:

| | |
|---|---|
| [أ] | تێڕامان و وردبوونەوەو تێگەشتن لە قورئانی پیرۆز. |
| [ب] | ملکەچبوون بۆ خوا. |
| [ج] | دەربڕین بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان. |
| [د] | هەموویان. |

12- له گرنگییه‌كانی زانستی ته‌جوید ................................. .

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | به‌ جێهێنانی فه‌رمانی خوا | [ج] | ده‌ركه‌وتنی ئیعجازی قورئان |
| [ب] | جوانكردنی خوێندنه‌وه‌و ڕازاندنه‌وه‌ی | [د] | هه‌موویان. |

13- جوانخوێندنه‌وه‌ی قورئان له‌ سه‌ر زانینی ......................... بنیاتده‌نرێت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | جێده‌نگی پیته‌كان | [ج] | وه‌ستان‌وده‌ستپێكردن |
| [ب] | سیفه‌تی پیته‌كان | [د] | هه‌موویان |

14- حوكمی فێربوونی ته‌جویدی كرده‌یی (التجويدُ العَمَليّ) ............. .

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | فه‌رزی كیفایه‌یه | [ج] | فه‌رزی عه‌ینه |
| [ب] | سوننه‌ته | [د] | ڕێپێدراوه |

15- حوكمی فێربوونی ته‌جویدی زانستیی (التجويدُ العِلْميّ) ..................... .

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | فه‌رزی كیفایه‌یه | [ج] | فه‌رزی عه‌ینه |
| [ب] | سوننه‌ته | [د] | ڕێپێدراوه |

16- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه‌: باشترینتان ئه‌و كه‌سه‌یه كه‌:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | قورئان فێر ببێت | [ج] | قورئان فێرببێت و كه‌سانی تریش فێركات |
| [ب] | خه‌ڵك فێری قورئان بكات | [د] | قورئان بخوێنێت |

17- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه‌: هه‌ر كۆمه‌ڵێك له ماڵێك له ماڵه‌كانی خوادا كۆببنه‌وه قورئان بخوێننه‌وه‌و به یه‌كتری بڵێنه‌وه ئه‌وا بێگومان:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | ئارامی داده‌به‌زێت به سه‌ریاندا | [ج] | فریشته‌كان چوارده‌وریان ده‌ده‌ن |
| [ب] | به‌زه‌یی دایان ده‌پۆشێت | [د] | هه‌موویان |

18- له فەرمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: ئه‌وه‌ی پێشنوێژی ده‌كات بۆ خه‌ڵك باشاره‌زاترینیان بێت له:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | خوێندنی قورئاندا | [ج] | له فه‌رمووده‌دا |
| [ب] | ته‌فسیری قورئاندا | [د] | له شه‌ریعه‌تدا |

19- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: ئه‌و كه‌سه‌ی قورئان به جوانی ده‌خوێنێته‌وه:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | دوو پاداشتی هه‌یه | [ج] | سێ پاداشتی هه‌یه |
| [ب] | ده پادشتی هه‌یه | [د] | له گه‌ڵ فریشته به‌رێزو پاكه‌كاندایه |

20- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: ئه‌و كه‌سه‌ی قورئان ده‌خوێنێتو زمانی ته‌ته‌ڵه ده‌كات تیایداو له سه‌ر زاری قورسه:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | دوو پاداشتی هه‌یه | [ج] | سێ پاداشتی هه‌یه |
| [ب] | ده پادشتی هه‌یه | [د] | له گه‌ڵ فریشته به‌رێزو پاكه‌كاندایه |

21- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: نموونه‌ی بڕواداری قورئانخوێن وه‌ك نموونه‌ی:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | نارنجه | [ب] | خورمایه | [ج] | ڕێحانه‌یه | [د] | كوژاڵكه‌یه |

22- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: نموونه‌ی بڕواداری قورئاننه‌خوێن وه‌ك نموونه‌ی

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | نارنجه | [ب] | خورمایه | [ج] | ڕێحانه‌یه | [د] | كوژاڵكه‌یه |

23- له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: نموونه‌ی دووڕووی قورئانخوێن وه‌ك

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | نارنجه | [ب] | خورمایه | [ج] | ڕێحانه‌یه | [د] | كوژاڵكه‌یه |

24- له فەرمووده‌یەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووه که: نموونەی دوو ڕووی قوڕئاننەخوێن وەك

| [أ] | نارنجه | [ب] | خورمایه | [ج] | ڕێحانەیه | [د] | کوژاڵکەیه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

25- بە گوێرەی فەرمووده‌کەی پێغەمبەر (ﷺ): له ڕۆژی دواییدا قوڕئانی پیرۆزو ئەوانەی کاریان پێکردووه دەهێنرێن هەردوو سووڕەتی (البقرة)و (آل عمران) له شێوەی ........................ له پێشیانەوەن بەرگرییان لێدەکەن.

| [أ] | دوو پەڵه هەور |
|---|---|
| [ب] | دوو سێبەر له نێوانیاندا ڕووناکیەك هەیه |
| [ج] | دوو پۆل باڵندە باڵیان ڕاخستووه له ئاسماندا |
| [د] | هەرسێکیان |

26- له فەرمووده‌یەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووه: ئەو کەسەی هیچ قوڕئانی له سنگدا نییه وەك ................ وایه.

| [أ] | زەوییەکی وشك | [ج] | دارێکی بێ بەر |
|---|---|---|---|
| [ب] | خانوویەکی وێران | [د] | هەموویان |

27- له فەرمووده‌یەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووه: له ئیمه نییه ئەو کەسەی که قوڕئان بە ................ نەخوێنێت.

| [أ] | له سەرخۆ | [ب] | پەله | [ج] | دەنگەوه | [د] | (أ + ب) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

28- له فەرمووده‌یەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووه: له قوڕئان تێناگات کەسێك له ماوەی ...... ڕۆژ کەمتردا بیخوێنێتەوه.

| [أ] | سێ | [ب] | یەك | [ج] | پێنج | [د] | دوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

29- ئیبن مەسعود ﷺ دەڵێت: هەر پیاوێك لە ئێمە ....... ئایەتێك لە قورئانی لە بەرکردایە بە سەریدا تێنەدەپەڕی تاوەکو مانای نەزانیبایەو کاری پێنەکردبایە.

| [أ] | بیست | [ب] | پێنج | [ج] | دە | [د] | یەك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

30- حوکمی گوێگرتن و بێدەنگبوون لە کاتی بیستنی قورئاندا چیە؟

| [أ] | پێویستە | [ب] | سوننەتە | [ج] | ڕێپێدراوە | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

31- ژمارەی کڕنووشەکان (السجدات) لە قورئانی پیرۆزدا چەندە؟

| [أ] | 17 | [ب] | 16 | [ج] | 15 | [د] | 14 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

32- حوکمی کڕنووشبردن لە کاتی خوێندن یاخود بیستنی ئایەتی کڕنووشدا (السجدة)دا چیە ؟

| [أ] | فەرزی کیفایەیە | [ج] | فەرزی عەینە |
|---|---|---|---|
| [ب] | سوننەتە | [د] | ڕێپێدراوە |

33- کڕنووشی خوێندنەوە (سجدة التلاوة) پێویستی بە ................. نییە.

| [أ] | سەلامدانەوە | [ج] | دەستنوێژ |
|---|---|---|---|
| [ب] | ڕوو لە ڕووگە (القبلة) | [د] | هیچیان |

34- پلەی (التحقیق) واتە: قورئانخوێندنەوە بە ............... لە گەڵ ڕەچاوکردنی گشت یاساکانی تەجوید.

| [أ] | لەسەرخۆیی | [ب] | خێرایی | [ج] | مامناوەندی | [د] | هەموویان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

35- پلەی (التدویر) واتە: قورئانخوێندنەوە بە ............... لە گەڵ ڕەچاوکردنی گشت یاساکانی تەجوید.

| [أ] | لەسەرخۆیی | [ب] | خێرایی | [ج] | مامناوەندی | [د] | هەموویان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

36- پلەی (الحدر) واتە: قورئانخوێندنەوە بە ............ لە گەڵ ڕەچاوکردنی گشت یاساکانی تەجوید.

| [أ] | لەسەرخۆیی | [ب] | خێرایی | [ج] | مامناوەندی | [د] | هەموویان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

37- (الترتیل) واتە: قورئانخوێندنەوە بە ............ لە گەڵ ڕەچاوگرتنی گشت یاساکانی تەجوید.

| [أ] | لەسەرخۆیی | [ب] | خێرایی | [ج] | مامناوەندی | [د] | هەموویان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

38- (الزمزمة): خوێندنەوەی قورئان بە دەنگێکی نزم کە بە تەواوی نەبیسترێت، بەشێکە لە:

| [أ] | التحقیق | [ب] | التدویر | [ج] | الحدر | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

39- کام جۆر خوێندنەوەی قورئان زانایان بە دروستی نازانن ؟

| [أ] | الزمزمة | [ب] | الهذرمة، الهذّ | [ج] | (أ + ب) | [د] | الحدر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

40- هەر یەك لە هەڵەی ئاشکراو (اللحن الجليّ) هەڵەی شاراوە (اللحن الخفيّ) بەشدارن لە :

| [أ] | تێکدانی یاساکانی تەجوید | [ج] | گۆڕینی جووڵە (الحركة) |
|---|---|---|---|
| [ب] | گۆڕینی پیت | [د] | هەموویان |

41- لە شێوەکانی هەڵەی ئاشکرا (اللحن الجليّ):

| [أ] | زیادکردنی پیت | [ج] | گۆڕینی پیت |
|---|---|---|---|
| [ب] | کەمکردنی پیت | [د] | هەموویان |

42- چارەسەرکردنی هەڵە لە دەربڕینی پیتدا لە ڕێگەی ............ ەوە دەبێت.

| [أ] | زمانی عەرەبی | [ج] | جێدەنگەکان (المخارج) |
|---|---|---|---|
| [ب] | سیفەتە هەمیشەییەکان | [د] | سیفەتە کاتیەکان |

43- چارەسەرکردنی هەڵە لە جووڵەدا (الحركة) لە ڕێگەی .................. دەبێت.

| [أ] | زمانی عەرەبییەوە | [ج] | جێدەنگەکانەوە (المخارج) |
|---|---|---|---|
| [ب] | سیفەتەوە | [د] | زانستی ڕەوانبێژیەوە (البلاغة) |

44- هەڵەی ئاشکرا (اللحن الجلي) لە هەڵەی شاراوە (اللحن الخفيّ) جیادەکرێتەوە بە:

| [أ] | تێکدانی وشەکە | [ج] | تێکدانی یاساکانی تەجوید |
|---|---|---|---|
| [ب] | تێکنەدانی یاساکانی تەجوید | [د] | هەموویان |

45- حوکمی هەڵەی ئاشکرا (اللحن الجليّ) چیە؟

| [أ] | باش نیە | [ج] | حەڕامە |
|---|---|---|---|
| [ب] | ڕای جیاوازی لەسەرە | [د] | ئاساییە |

46- لەو هەڵە شاراوانەی کە قوڕئانخوێنان (القرّاء) بە گشتی هەستی پێدەکەن وازهێنانە لە:

| [أ] | تێهەڵکیشکردن (الإدغام) | [ج] | شاردنەوە (الإخفاء) |
|---|---|---|---|
| [ب] | ئاشکراکردن (الإظهار) | [د] | هەموویان |

47- لەو هەڵە شاراوانەی کە تەنها قوڕئانخوێنی لێهاتوو هەستی پێدەکات.

| [أ] | وازهێنان لە تێهەڵکێش | [ج] | پێنەدانی مینگە |
|---|---|---|---|
| [ب] | دووبارەکردنەوەی پیتی (ر) | [د] | هەموویان |

48- حوکمی هەڵەی شاراوە (اللحن الخفي) بۆ کەسی کەمتەرخەم چیە ؟

| [أ] | نا پەسەندە | [ج] | ڕێپێدراوە |
|---|---|---|---|
| [ب] | ڕای جیاوازی لەسەرە | [د] | حەڕامە |

49- هەڵەی چاوەڕوانکراو لە وشەی ﴿وُسْعَهَا﴾ البقرة: 286، ............ پیتی واوە.

| [أ] | ژێردارکردنی (کسر) | [ج] | سەردارکردنی (فتح) |
|---|---|---|---|
| [ب] | زەننەدارکردنی (إسکان) | [د] | (أ+ب) |

50- هەڵەی چاوەڕوانکراو لە وشەی ﴿الْجُمُعَةِ﴾ الجمعة: 9، ............. پیتی میمە.

| [أ] | ژێردارکردنی (کسر) | [ج] | سەردارکردنی (فتح) |
|---|---|---|---|
| [ب] | زەننەدارکردنی (إسکان) | [د] | (أ+ب) |

51- هەڵەی چاوەڕوانکراو لە وشەی ﴿نَعْبُدُ﴾ الفاتحة: 5، ............... پیتی دالە.

| [أ] | زەننەدارکردنی (إسکان) | [ج] | سەردارکردنی (فتح) |
|---|---|---|---|
| [ب] | گۆڕینی (ضمة) بە واو | [د] | (أ+ب) |

52- هەڵەی چاوەڕوانکراو لە وشەی ﴿كُفُوًا﴾ الإخلاص: 4، ........ پیتی (ف)یە.

| [أ] | ژێردارکردنی (کسر) | [ج] | سەردارکردنی (فتح) |
|---|---|---|---|
| [ب] | زەننەدارکردنی (إسکان) | [د] | (أ+ب) |

53- کێ بوو لە سەردەمی شوێنکەوتواندا (التابعین) قورئانی پیرۆزی دابەشکرد بە سەر جوزءو حیزب و بەشە حیزبدا ؟

| [أ] | نصر بن عاصم | [ج] | الحسن البصري |
|---|---|---|---|
| [ب] | أبو الأسود الدؤلي | [د] | عاصم بن أبي النّجود |

## بەشی دووەم

## پەناگرتن و (الإستعاذة) ناوی خواهێنان (البسملة)

54- (الإستعاذة) ........... شێوەی هەیە.

| [أ] | یەك | [ب] | دوو | [ج] | سێ | [د] | چوار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

55- وشەی (هَمزِهِ) لە (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيمِ مِن هَمزِهِ وَنَفخِهِ وَنَفثِهِ) بە واتای ........ دێت.

| [أ] | شیعرو هۆنراوە | [ج] | خۆ بە گەورەزانین |
|---|---|---|---|
| [ب] | شێتی وخنکاندن | [د] | فریودان |

56- وشەی (نَفخِهِ) لە (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيمِ مِن هَمزِهِ وَنَفخِهِ وَنَفثِهِ) بە واتای ........ دێت.

| [أ] | شیعرو هۆنراوە | [ج] | خۆ بە گەورەزانین |
|---|---|---|---|
| [ب] | شێتی وخنکاندن | [د] | فریودان |

57- وشەی (نَفثِهِ) لە (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجِيمِ مِن هَمزِهِ وَنَفخِهِ وَنَفثِهِ) بە واتای ........ دێت.

| [أ] | شیعرو هۆنراوە | [ج] | خۆ بە گەورەزانین |
|---|---|---|---|
| [ب] | شێتی وخنکاندن | [د] | فریودان |

58- لە چەند شوێندا قورئانخوین بە دەنگی بەرز (الاستعاذة) دەخوێنێت؟

| [أ] | یەك | [ب] | سێ | [ج] | پێنج | [د] | حەوت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

59- لە چەند شوێندا قورئانخوین بە دەنگی نزم (الاستعاذة) دەخوێنێت؟

| [أ] | یەك | [ب] | پێنج | [ج] | سێ | [د] | حەوت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

60- (الإستعاذة)............ لە قورئانی پیرۆز.

| [أ] | بەشێکە | [ج] | بەشێکە لە سوورەتی (الفاتحة) |
|---|---|---|---|
| [ب] | بەشێك نیە | [د] | بەشێکە لە سوورەتی (التوبة) |

61- حوکمی خوێندنی (الإستعاذة) لە لای زۆرینەی زانایان .............. .

| [أ] | پێویستە | [ب] | ڕێپێدراوە | [ج] | سوننەتە | [د] | (أ+ب) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

62- حوکمی خوێندنی (الإستعاذة) لە لای کەمینەی زانایان .............. .

| [أ] | پێویستە | [ب] | ڕێپێدراوە | [ج] | سوننەتە | [د] | (أ+ب) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

63- قورئانخوێن (الإستعاذة) بە دەنگی ............ دەخوێنێت ئەگەر کەسێکی دیکە گوێی لێبگرێت.

| [أ] | نزم | [ب] | بەرز | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

64- قورئانخوێن (الإستعاذة) بەدەنگی .......... دەخوێنێت لە قورئانخوێندنی بەکۆمەڵدا ئەگەر یەکەم خوێنەر نەبێت.

| [أ] | نزم | [ب] | بەرز | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

65- قورئانخوێن (الإستعاذة) بە دەنگی ............ دەخوێنێت لە کاتی فێرکردن و وتنەوەی قورئانی پیرۆزدا.

| [أ] | نزم | [ب] | بەرز | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

66- قورئانخوێن (الإستعاذة) بە دەنگی ........... دەخوێنێت ئەگەر تەنها بۆ خۆی قورئان بخوێنێت.

| [أ] | بەرز | [ب] | نزم | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

67- قوڕئانخوێن (الإستعاذة) بە دەنگی ............. دەخوێنێت لە کاتی دەستپێکردنی قوڕئانخوێندنی بەکۆمەڵدا.

| [أ] | نزم | [ب] | بەرز | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

68- قوڕئانخوێن (الاستعاذة) بە دەنگی ............. دەخوێنێت لە نوێژدا، تاك بێت یاخود بە کۆمەڵ.

| [أ] | نزم | [ب] | بەرز | [ج] | هەردووکیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

69- ئەم شێوە (إستعاذة)یە تەواو بکە: (أَعُوذُ بِاللهِ ............ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ)

| [أ] | الغفور الرحيم | [ج] | السميع العليم |
|---|---|---|---|
| [ب] | الحكيم العليم | [د] | السميع البصير |

70- لە چ کاتێکدا قوڕئانخوێن پێویستی بە دووبارە خوێندنەوەی (الإستعاذة) نیە؟

| [أ] | پژمەو کۆکە | [ج] | قسەکردنی پەیوەست بەخوێندنەوەی قوڕئانەوە |
|---|---|---|---|
| [ب] | هەناسە توندی | [د] | هەموویان |

71- (البسملة) چەند شێوەی هەیە؟

| [أ] | دوو | [ب] | یەك | [ج] | سێ | [د] | چوار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

72- بە کۆدەنگی قوڕئانخوێنان (القُرَّاء) ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ بەشە ئایەتێکە لە سوورەتی:

| [أ] | التوبة | [ب] | الإخلاص | [ج] | الأنفال | [د] | النمل |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

73- بە کۆدەنگی قوڕئانخوێنان (القُرَّاء) ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئایەتێك نییە لە سوورەتی:

| [أ] | التوبة | [ب] | الإخلاص | [ج] | الأنفال | [د] | النمل |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

74- خوێندنی ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ لە نێوان سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ڕیوایەتی (حفص) عن (عاصم)دا .............

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | پێویستە | [ج] | ڕێگەپێدراوە |
| [ب] | سوننەتە | [د] | پێویستە جگە لە سوورەتی (التوبة) |

75- لە کاتی گەیاندنی سوورەتی (الأنفال) بە (التوبة) چەند شێوەی هەیە؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | چوار | [ب] | سێ | [ج] | دوو | [د] | یەك |

76- بۆ دەستپێکردن بە سوورەتەکانی قورئان جگە لە سوورەتی (التوبة) ............ شێواز هەیە.

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | دوو | [ب] | چوار | [ج] | سێ | [د] | یەك |

77- بۆ دەستپێکردن بە سوورەتی (التوبة) ............ شێواز هەیە.

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | دوو | [ب] | چوار | [ج] | سێ | [د] | یەك |

78- شێوەی نادروست لە کاتی خوێندنی (البسملة) لە نێوان دوو سورەتدا جگە لە نێوان (الأنفال) و(التوبة)- کامەیە؟

| | |
|---|---|
| [أ] | کۆتایی سوورەت (وصل) ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (قطع) سەرەتای سوورەت |
| [ب] | کۆتایی سوورەت قطع ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ قطع سەرەتای سوورەت |
| [ج] | کۆتایی سوورەت وصل ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وصل سەرەتای سوورەت |
| [د] | کۆتایی سوورەت قطع ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وصل سەرەتای سوورەت |

79- خوێندنی ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ لە ناوەڕاستی سوورەتەکاندا ............

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ڕێپێدراوە | [ب] | پاداشتی هەیە | [ج] | (أ+ب) | [د] | پێویستە |

80- شێوەی دروست لە نێوان سوورەتی (الأنفال) و سوورەتی (التوبة)دا کامەیە ؟

| | |
|---|---|
| [أ] | ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥﴾ قطع ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ... ١﴾ |
| [ب] | ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥﴾ سكت ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ... ١﴾ |
| [ج] | ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥﴾ وصل ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ... ١﴾ |
| [د] | هەرسێکیان |

## بەشی سێیەم

## جێدەنگی پیتەکان ( مخارج الحروف )

81- ئەو شوێنەی کە دەنگی پیت تیایدا کۆتایی دێت پێی دەوترێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | جێدەنگ (المخرج) | [ج] | مینگە (الغنة) |
| [ب] | درێژکردنەوە (المدّ) | [د] | شاردنەوە (الإخفاء) |

82- بە شێوەیەکی گشتی جێدەنگەکان چەند جۆرن؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | 4 | [ب] | 2 | [ج] | 17 | [د] | 21 |

83- ئەو جێدەنگەی کە پشت دەبەستێت بە بەشێکی دیاریکراو پێی دەوترێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | جێدەنگی خەمڵێنراو | [ج] | سیفەتی پیتەکان |
| [ب] | پیتە سەرەکیەکان | [د] | جێدەنگی دیاریکراو |

84- جێدەنگی دیاریکراو پشت دەبەستێت بە بەشێکی دیاریکراو لە:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | گەروو | [ب] | زمان | [ج] | لێو | [د] | (أ + ب + ج) |

85- جێدەنگی خەمڵێنراو ئەو جێدەنگەیە کە:

| | |
|---|---|
| [أ] | پشت بە شوێنێکی دیاریکراو دەبەستێت |
| [ب] | پشت بە شوێنێکی دیاریکراو نابەستێت |
| [ج] | قبوڵی زیادکردن و کەم کردن ناکات |
| [د] | (ب + ج) |

86- جێدەنگی خەمڵێنراو شوێنی دەرچوونی پیتەکانی ............ .

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | اللين | [ب] | الإظهار | [ج] | الإخفاء | [د] | المد |

87- بۆ دۆزینەوەی جێدەنگی (ألف) دەبێ پیتێکی ............ بخرێتە پێشیەوە؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | مفتوح | [ب] | مكسور | [ج] | مضموم | [د] | ساكن |

88- بۆ دۆزینەوەی جێدەنگی هەر پیتێك (جگە لە پیتەكانی مەدد) دەبێت ......... بدەین بە پیتەكەو لە پاش هەمزەیەكی جوولاو بیخوێنینەوە.

| [أ] كسرة | [ب] فتحة | [ج] ضمة | [د] سكون یان شدة |
|---|---|---|---|

89- پیتە سەرەكیەكانی زمانی عەرەبی (الهجائي) چەند پیتن؟

| [أ] 28 | [ب] 29 | [ج] 30 | [د] 31 |
|---|---|---|---|

90- پیتە لاوەكیەكان ئەو پیتانەن كە لە نێوان ......................... دەخوێنرێنەوە.

| [أ] دوو جێدەنگدا | [ب] دوو پیتدا | [ج] دوو سیفەتدا | [د] (أ + ب) |
|---|---|---|---|

91- ......... پیتێكی لاوەكییە لە نێوان هەمزەو ئەلیفدا دەخوێنرێتەوە.

| [أ] هەمزەی ئاسانكراو (الهمزة المسهّلة) | [ج] ئەلیفی گەورە |
|---|---|
| [ب] ئەلیفی لاركراو (الألف الممالة) | [د] (أ + ب) |

92- لە سەر ڕای بەهێز ژمارەی پیتە لاوەكییەكان چەندە؟

| [أ] 6 | [ب] 4 | [ج] 5 | [د] 3 |
|---|---|---|---|

93- ......... پیتێكی لاوەكییە لە نێوان (ألف)و (ي)دا دەخوێنرێتەوە.

| [أ] هەمزەی ئاسانكراو (الهمزة المسهّلة) | [ج] ئەلیفی گەورە |
|---|---|
| [ب] ئەلیفی لاركراو (الألف الممالة) | [د] (أ + ب) |

94- ژمارەی جێدەنگە تایبەتەكان لە سەر ڕای زۆرینەی قوڕئانخوێنان چەندن؟

| [أ] 5 | [ب] 11 | [ج] 17 | [د] 29 |
|---|---|---|---|

95- جێدەنگە تایبەتەكان بەسەر ......... جێدەنگی گشتیدا دابەش دەبن.

| [أ] 5 | [ب] 11 | [ج] 17 | [د] 29 |
|---|---|---|---|

96- پیتەکانی (مەدد) لە جێدەنگی ........... دەردەچن.

| [أ] | الحلق | [ب] | الجوف | [ج] | الشفتان | [د] | الخيشوم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

97- پیتە هەواییەکان بریتین لە پیتەکانی ..........

| [أ] | الحلق | [ب] | الشفتان | [ج] | الجوف | [د] | الخيشوم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

98- بۆشایی (الجوف) شوێنی دەرچوونی چەند پیتە؟

| [أ] | 3 | [ب] | 5 | [ج] | 6 | [د] | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

99- جێدەنگی بۆشایی (الجوف) ..........................

| | |
|---|---|
| [أ] | یەك جێدەنگی گشتییە بۆ یەك جێدەنگی تایبەتی خەملێنراو. |
| [ب] | یەك جێدەنگی گشتییە بۆ سێ جێدەنگی تایبەتی خەملێنراو. |
| [ج] | یەك جێدەنگی گشتییە بۆ چوار پیت. |
| [د] | هیچیان. |

100- گەروو (الحلق ) شوێنی دەرچوونی چەند پیتە؟

| [أ] | 3 | [ب] | 5 | [ج] | 6 | [د] | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

101- گەروو (الحلق) چەند جێدەنگی تایبەتی هەیە؟

| [أ] | 3 | [ب] | 6 | [ج] | 4 | [د] | 8 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

102- دوورترینی گەروو (أقصى الحلق) شوێنی دەرچوونی .................

| [أ] | (ع) و (ح) | [ب] | (غ) و (خ) | [ج] | (الهمزة) و (ه) | [د] | (ه) و (ح) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

103- ناوەڕاستی گەروو (وسط الحلق) شوێنی دەرچوونی هەردوو پیتی ..........

| [أ] | (ع) و (ح) | [ب] | (الهمزة) و(ه) | [ج] | (غ) و (خ) | [د] | (ه) و (ح) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

104- نزیکترینی گەروو (أدنی الحلق) شوێنی دەرچوونی ..............

| [أ] | (ع) و (ح) | [ب] | (غ) و (خ) | [ج] | (الهمزة) و (ه) | [د] | (ه) و (ح) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

105- دوورترینی گەروو (أقصی الحلق) واتە:

| [أ] | لە سنگەوە دوورە | [ج] | لە زمانەوە نزیکە |
|---|---|---|---|
| [ب] | لە دەمەوە نزیکە | [د] | لە دەمەوە دوورە |

106- نزیکترینی گەروو (أدنی الحلق) واتە:

| [أ] | لە سنگەوە دوورە | [ج] | لە زمانەوە نزیکە |
|---|---|---|---|
| [ب] | لە دەمەوە نزیکە | [د] | لە دەمەوە دوورە |

107- خودی زمان بە گشتی دەبێت بە چەند بەشەوە ؟

| [أ] | 2 | [ب] | 3 | [ج] | 4 | [د] | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

108- جێدەنگە تایبەتەکانی زمان چەندن ؟

| [أ] | 4 | [ب] | 10 | [ج] | 17 | [د] | 18 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

109- پیتەکانی زمان چەندن ؟

| [أ] | 4 | [ب] | 10 | [ج] | 17 | [د] | 18 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

110- دوورترینی زمان (أقصی اللسان) لە گەڵ ئەو بەشەی کە بەرامبەریەتی ل

ئاسمانەی دەم جێدەنگە بۆ ....... .

| [أ] | س | [ب] | ك | [ج] | ق | [د] | غ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

111- دوورترین پیت لە پیتەکانی زمان کە لە دەمەوە دوورە پیتی:

| [أ] | ق | [ب] | ج | [ج] | ك | [د] | ء |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

112- دوورترین پیت لە پیتەکانی گەروو (الحلق) کە لە دەمەوە دوورە پیتی:

| [أ] | ه | [ب] | خ | [ج] | ع | [د] | ء |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

113- لە دوورترینی زماندا (أقصی اللسان) دوای پیتی (ق) چ پیتێك دێت ؟

| [أ] | ك | [ب] | ج | [ج] | ت | [د] | ض |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

114- ناوەڕاستی زمان لە گەڵ ئەو بەشەی بەرامبەریەتی لە ئاسمانەی دەم جێدەنگە

بۆ پیتەکانی ..........

| [أ] | (د، ج، ش، ي) | [ج] | (ج، ش، ي) |
|---|---|---|---|
| [ب] | (ح، ش، ي) | [د] | (ض، ج، ش، ي) |

115- لە کاتی دەربڕینی کام لەم پیتانە ناوەڕاستی زمان بەتەواوی بەشی سەرەوەی

پووکەوە دەنوسێت ؟

| [أ] | ش | [ب] | ي | [ج] | ج | [د] | ق |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

116- لە کاتی دەربڕینی کام لەم پیتانە ناوەڕاستی زمان بە تەواوی نانوسێت بە

ئاسمانەی دەمەوە؟

| [أ] | ج | [ب] | ي | [ج] | ح | [د] | غ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

117- لە کاتی دەربڕینی کام لەم پیتانە ناوەڕاستی زمان زیاتر لە بەشی سەرەوەی

پووکەوە دوورەو بۆ شایی نێوانیان زیاترە؟

| [أ] | ج | [ب] | ش | [ج] | ي | [د] | غ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

118- لە کام لەم وشانەدا پیتی (ي) درێژکردنەوە (المد) نیە ؟

| [أ] | ﴿ بِدِينَارٍ ﴾ | [ب] | ﴿ وَنَمِيرُ ﴾ | [ج] | ﴿ نَسْتَعِينُ ﴾ | [د] | ﴿ قِيَمًا ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

119- لە کام لەم وشانەدا پیتی (ي) درێژکردنەوەیە (المد) ؟

| [أ] | ﴿ عَلَيْهِمْ ﴾ | [ب] | ﴿ يَعْمَلُونَ ﴾ | [ج] | ﴿ وَغِيضَ ﴾ | [د] | ﴿ يُمَارُونَ ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

120- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی سەوز دیاریکراون پێیان دەوترێت ............... .

| [أ] | الثنايا | [ب] | الطواحن | [ج] | الأنياب | [د] | الضواحك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

121- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی سوور دیاریکراون پێیان دەوترێت ............... .

| [أ] | الثنايا | [ج] | الأنياب |
|---|---|---|---|
| [ب] | الرَّباعيات | [د] | الضواحك |





122- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی شینی تێر دیاریکراون پێیان دەوترێت ............... .

| [أ] | النواجذ | [ج] | الطواحن |
|---|---|---|---|
| [ب] | الرَّباعيات | [د] | الأنياب |

123- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی شینی کاڵ دیاریکراون پێیان دەوترێت ........... .

| [أ] | الثنايا | [ب] | الضواحك | [ج] | الطواحن | [د] | الأنياب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

124- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی زەرد دیاریکراون پێیان دەوترێت ............... .

| [أ] | النواجذ | [ب] | الضواحك | [ج] | الطواحن | [د] | الثنايا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

125- ئەو دانانەی کە بە ڕەنگی پرتەقاڵی دیاریکراون پێیان دەوترێت ............... .

| [أ] | النواجذ | [ب] | الضواحك | [ج] | الرَّباعيات | [د] | الأنياب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

126- یەکێك لە لێوارەکانی زمان (حافة اللسان ) یاخود هەردووکیان لەگەڵ دیوی ناوەوەی دانە خرێکانی سەرەوە (الأضراس العليا) جێدەنگە بۆ ........ .

| [أ] | ظ | [ب] | ص | [ج] | ض | [د] | ط |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

127- كام لەم پیتانە دەربڕینی بەلای ڕاستی زمان ئاسانترە ؟

| [أ] | ر | [ب] | ل | [ج] | ض | [د] | ص |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

128- نزیکترین هەردوو لێواری زمان (أدنى حافتي اللسان) لە گەڵ پووکی دانەکانی سەرەوە (پێکەنین وکەڵبەو تەنیشتە بڕەڕو بڕەڕ) جێدەنگە بۆ .......... .

| [أ] | س | [ب] | ر | [ج] | ل | [د] | ش |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

129- كام لەم پیتانە فراوانترین جێدەنگی هەیە ؟

| [أ] | ل | [ب] | ض | [ج] | ن | [د] | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

130- كام لەم پیتانە دەربڕینی بەلای چەپی زمان ئاسانترە ؟

| [أ] | ض | [ب] | ل | [ج] | ط | [د] | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

131- جێدەنگی پیتی ........: پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ ئەو بەشەی کە بەرامبەریەتی لە پووکی هەردوو دانی بڕەری سەرەوە کەمێك خوار جێدەنگی پیتی (ل).

| [أ] | ط | [ب] | ت | [ج] | ر | [د] | ن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

132- پێشەوەی زمان (طرف اللسان) و بەشێکی کەمیش لە پشتی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی بەرامبەری لە پووکی دوو دانی سەرەوە، کەمێك خوار جێدەنگی (ل) جێدەنگە بۆ پیتی ........ .

| [أ] | س | [ب] | ت | [ج] | ر | [د] | ن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

133- پێشەوە ی زمان (طرف اللسان) لە گەڵ ڕەگی بڕەڕەکانی سەرەوە جێدەنگە بۆ ............ .

| [أ] | ظ، ث، ذ | [ب] | ط، د، ت | [ج] | س، ز، ص | [د] | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

134- پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ ڕەگی بڕەڕەکانی سەرەوە جێدەنگی ئەم سێ پیتانەیە لە دوورترینیان لە بڕەوە بۆ نزیکترین بەم شێوەیە:

| [أ] | (ط، ت، د) | [ب] | (د، ت، ط) | [ج] | (ط، د، ت) | [د] | (ت، د، ط) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

135- کۆتایی پێشەوەی زمان و (طرف اللسان) بەشی سەرەوەی دانەکانی بڕەڕی خوارەوە جێدەنگی ئەم پیتانەیە:

| [أ] | ظ، ث ،ذ | [ب] | ط، د، ت | [ج] | س، ص، ز | [د] | ر، ن، ل |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

136- پێشەوەی زمان ( طرف اللسان) و بەشی سەرەوەی دانەکانی بڕەڕی خوارەوە لە گەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی تەسك بۆ هەوا ئەم بۆشاییە لە کام پیت لە هەموویان زیاترە:

| [أ] | ص | [ب] | ز | [ج] | س | [د] | ظ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

137- پێشەوەی زمان (طرف اللسان)و بەشی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە جێدەنگە بۆ ..............

| [أ] | (ط، د، ت) | [ب] | (ث، ذ، ظ) | [ج] | (س، ز،ص) | [د] | (ج، ش، ي) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

138- لە کام پیتدا سەری زمان لەوانی تر زیاتر دێتە دەرەوە ؟

| [أ] | ذ | [ب] | ظ | [ج] | م | [د] | ث |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

139- هەردوو لێو (الشفتان) چەند پیت لە خۆ دەگرێت ؟

| [أ] | 2 | [ب] | 3 | [ج] | 4 | [د] | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

140- هەردوو لێو (الشفتان) چەند جێدەنگی تایبەت لە خۆ دەگرێت ؟

| [أ] | 2 | [ب] | 3 | [ج] | 4 | [د] | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

141- (الشفتان) هەردوو لێو جێدەنگە بۆ ..................

| [أ] | (م ،ب) | [ب] | (ف، و) | [ج] | (م، ب، ف، و) | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

142- له كام پیتی لێویدا داخستنی هەردوو لێو (الشفتان) زیاترە؟

| [أ] | لەپیتی (ب) | [ب] | لەپیتی (م) | [ج] | لەپیتی (ف) | [د] | وەك یەكن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

143- بۆ جیاكردنەوەی پیتی (ب) و (م) لە یەكتر وتراوە:

| | |
|---|---|
| [أ] | پیتی (م) پیتێكی (بحریّة)و پیتی (ب) پیتێكی (بریّة) |
| [ب] | پیتی (ب) پیتێكی (بحریّة) پیتی (م) پیتێكی (بریّة) |
| [ج] | پیتی (ب) بە تەواوی لێو دادەخرێت وپیتی (م) بۆشایی لە نێوان لێوەكاندا هەیە |
| [د] | پیتی (م) بە تەواوی لێو دادەخرێت و پیتی (ب) بۆشایی لە نێوان لێوەكاندا هەیە |

144- تەنها لە دەربڕینی یەك پیتدا لێو كۆدەكرێتەوە ئەویش پیتی .........

| [أ] | و | [ب] | ظ | [ج] | خ | [د] | ص |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

145- جێدەنگی پیتی (و) بە گشتی كوێیە ؟

| [أ] | تەنها الشفتان | [ب] | تەنها الجوف | [ج] | هەردووكیان | [د] | هیچیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

146- لە كام لەم وشانەدا پیتی (و) لێوی نیە ؟

| [أ] | ﴿ كُفُوًا ﴾ | [ب] | ﴿ يُوسُفَ ﴾ | [ج] | ﴿ ٱلۡوُثۡقَىٰ ﴾ | [د] | ﴿ وِقۡرًا ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

147- لە كام لەم وشانەدا پیتی (و) لێوییە ؟

| [أ] | ﴿ لَقُوا۟ ﴾ | [ب] | ﴿ سُوٓءٌ ﴾ | [ج] | ﴿ مُوسَىٰ ﴾ | [د] | ﴿ قَوۡلُهُمۡ ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

148- لێواری بڕەكانی سەرەوە لە گەڵ بەشی ناوەوەی لێوی خوارەوە چ پیتێكی لێ دەردەچێ؟

| [أ] | و | [ب] | م | [ج] | ف | [د] | ب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

149- کەپوو (الخیشوم) جێدەنگە بۆ:

| [أ] | مینگە (الغنة) | [ج] | پیتە لاوەکیەکان |
|---|---|---|---|
| [ب] | پیتەکانی درێژکردنەوە | [د] | هیچیان |

150- پیتەکانی بۆشایی (الحروف الجوفية) بە پیتەکانی ............... دەوترێت.

| [أ] | گەروو (الحلق) | [ج] | (اللين) |
|---|---|---|---|
| [ب] | درێژکردنەوە (المد) | [د] | (و، ي) غەیرە مەددی |

151- کام لەمانە نازناونین بۆ پیتەکانی ( ـَا، ـُو، ـِي) ؟

| [أ] | پیتەکانی مەدد | [ج] | پیتە هەواییەکان |
|---|---|---|---|
| [ب] | پیتەکانی بۆشایی | [د] | پیتەکانی گەروو |

152- بە پیتەکانی (أ، ه ،ع ،ح ،غ ،خ ) دەوترێت ...............

| [أ] | الحروف اللهوية | [ج] | الحروف الحلقية |
|---|---|---|---|
| [ب] | الحروف الهوائية | [د] | الحروف الأَسَلية |

153- پیتەکانی گەلالۆچ ( الحروف اللهوية) بریتیە لە پیتەکانی ...............

| [أ] | (ج ،ش ،ی) | [ب] | (ك، ق) | [ج] | (ط، ت، د) | [د] | (ص، ز، س) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

154- پیتە شەویلگەییەکان (الحروف الشجرية) بریتین لە:

| [أ] | (ف، و، ب، م) | [ج] | (ج، ش، ض، ي) |
|---|---|---|---|
| [ب] | (ظ، ذ، ث) | [د] | پیتەکانی مەدد |

155- (الذلقية) نازناوە بۆ پیتەکانی:

| [أ] | (ل، ن، ر) | [ب] | (ظ، ذ، ث) | [ج] | (ك، ق) | [د] | (ف، و، ب، م) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

156- (الحروف النطعية) نازناوه بۆ پیتەكانی:

| [أ] | (ص، ز، س) | [ب] | (ط، ت، د) | [ج] | (ل، ر، ن) | [د] | (ف، و، م، ب) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

157- پیتەكانی باریكایی زمان (الحروف الأسَلية )پیتەكانی:

| [أ] | (ط، د، ت) | [ب] | (ل، ن، ر) | [ج] | (س، ز، ص) | [د] | (ظ، ذ، ث) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

158- پیتە پووكیەكان ( الحروف اللثوية) بريتين له پیتەكانی:

| [أ] | (ص، ز، س) | [ب] | (ل، ن، ر) | [ج] | (ظ، ذ، ث) | [د] | (ط، د، ت) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

## بەشی چوارەم

## سیفەتی پیتەکان ( صفات الحروف )

159- ................. ئەو نیشانەو تایبەتمەندیانەن کە بە هۆیانەوە پیتەکانی پێ دەناسرێتەوە.

| [أ] | جێدەنگەکان | [ج] | سیفەتە کاتیەکان |
|---|---|---|---|
| [ب] | سیفەتە هەمیشەییەکان | [د] | (ب + ج) |

160- یەکیك لەم سیفەتانە دژی نیە.

| [أ] | الإستطالة | [ب] | الهَمس | [ج] | الرِّخاوة | [د] | الإنفتاح |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

161- سیفەتە هەمیشەییەکان (الصفاتُ اللازمة) کە بەشێکن لە پیتەکەو لێی جیانابنەوە لە سەر ڕای بەناوبانگی زانایان ............ سیفەتن.

| [أ] | (5) | [ب] | (14) | [ج] | (17) | [د] | (21) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

162- کام لەم سیفەتانەی خوارەوە کاتیە (عارض) لە هەندێ دۆخدا هەیەو لە هەندێ دۆخی تردا نیە؟

| [أ] | الهمس | [ب] | الشدة | [ج] | البينية | [د] | الإخفاء |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

163- یەکێك لەم سیفەتانە دژی هەیە.

| [أ] | القلقلة | [ب] | الإطباق | [ج] | الصفير | [د] | اللين |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

164- بەهێزترین پیت لە زمانی عەرەبیدا.

| [أ] | ض | [ب] | ظ | [ج] | ط | [د] | ص |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

165- کام پیت هەموو ئەم سیفەتانەی تێدایە: (الجهر، البينية، الإستفال، الإنفتاح، الإنحراف، التكرير)؟

| [أ] | ج | [ب] | ل | [ج] | ك | [د] | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

166- لاوازترین پیت له زمانی عەرەبیدا.

| [أ] | ث | [ب] | هـ | [ج] | ح | [د] | ف |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

167- سیفەتە بەهێزەکان چەند سیفەتن؟

| [أ] | 7 | [ب] | 9 | [ج] | 11 | [د] | 13 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

168- سیفەتە لاوازەکان چەند سیفەتن؟

| [أ] | 6 | [ب] | 7 | [ج] | 8 | [د] | 9 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

169- کام لەم سیفەتانە بە بەهێزو لاواز وەسف ناکرێت؟

| [أ] | الجهر | [ب] | التكرير | [ج] | الغنة | [د] | البينية |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

170- کام لەم کۆمەڵە پیتانە سیفەتی لاوازو بەهێزیان یەکسانە؟

| [أ] | (ء، غ، ل، م، ن) | [ج] | (ت، خ، ذ، س) |
|---|---|---|---|
| [ب] | (ب، ج، د، ص) | [د] | (ع، ك، ظ، ق) |

171- پیتەکانی درێژکردنەوە (ا، و، ي) تەنها یەك سیفەتی بەهێزیان تێدایە ئەویش سیفەتی ..............

| [أ] | الشِّدَّة | [ب] | الإنفتاح | [ج] | الجهر | [د] | الاستعلاء |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

172- ئەم ڕستەیە (فحثه شخصٌ سكت) پیتەکانی چ سیفەتێکن؟

| [أ] | الغنة | [ب] | الصفير | [ج] | الاطباق | [د] | الهمس |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

173- کام پیت لە پیتەکانی (الهمس) لە وانی تر بەهێزترە؟

| [أ] | خ | [ب] | ص | [ج] | ح | [د] | ك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

174- سیفەتی .......... لەم پیتانەدا: (أجد قط بكت) هەیە.

| [أ] | القلقلة | [ب] | الجهر | [ج] | الشدة | [د] | الإستعلاء |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

175- ......... بیستنە بە ڕوونی بە هۆی داخستنی دەنگە ژێیەکان ولەرینەوەیان و ڕێنەکردنی زۆرێك لە هەوای هەناسە.

| [أ] الشدة | [ب] الجهر | [ج] الاستعلاء | [د] الاستفال |
|---|---|---|---|

176- سیفەتی ......... لەم پیتانەدا: (عظم وزن قارىء ذی غض جد طلب) هەیە.

| [أ] الإطباق | [ب] الاستعلاء | [ج] الجهر | [د] الشّدة |
|---|---|---|---|

177- ............ گیران یا خود قەتیسبوونی دەنگە لە کاتی دەربڕینی پیتەکەدا لەبەر تەواوی پشتبەستن بەجێدەنگەکەیەوە، یان لە بەر داخستنی جێدەنگەکەی.

| [أ] الإستعلاء | [ب] الهمس | [ج] اللین | [د] الشدة |
|---|---|---|---|

178- (البینیة) یاخود (التوسط) سیفەتێکە لە نێوان :

| [أ] الهمس و الجهر | [ج] الشدة و الرخاوة |
|---|---|
| [ب] الاستعلاء و الاستفال | [د] الاطباق و الانفتاح |

179- ............. ڕێکردنی دەنگە لە کاتی دەربڕینی پیتەکەدا.

| [أ] الرِّخاوة | [ب] الهمس | [ج] اللین | [د] البینیة |
|---|---|---|---|

180- سیفەتی .............. لە پیتەکانی (لن عمر)دایە.

| [أ] اللین | [ب] البینیة | [ج] الاستعلاء | [د] الصفیر |
|---|---|---|---|

181- پیتەکانی زمانی عەرەبی لە ڕووی ڕێکردنی دەنگ و هەناسەوە دەبن بە چەند کۆمەڵەوە؟

| [أ] 4 | [ب] 5 | [ج] 6 | [د] 6 |
|---|---|---|---|

182- بەم پیتانە (خُصَّ ضَغطٍ قظ) دەوترێت پیتەکانی ............ .

| [أ] الإستعلاء | [ب] الإطباق | [ج] الهمس | [د] الشدة |
|---|---|---|---|

183- پیتەکانی توند و ئاشکرا (شدیدة مجهورة ) بریتین لە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | قطب جد | [ج] | قطب جد + الهمزة |
| [ب] | أجدُ قط بكت | [د] | قطب جد + ك |

184- هەردوو پیتی (ک، ت) پیتەکانی

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | توندوئەسپایین (شدیدة مهموسة) | [ج] | ئاشکراو ن (مجهورة رخـوة ) |
| [ب] | توندوئاشکران ( شدیدة مجهورة) | [د] | چپەو نەرمن (مهموسة رخوة) |

185- ئەو پیتانەی دەنگ لە گەڵیان ڕێدەکات و هەناسە لە گەڵیان دەگیرێت کامانەن؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | شديدة مهموسة | [ج] | مجهورة رخـوة |
| [ب] | شديده مجهورة | [د] | مهموسة رخوة |

186- بەم پیتانە (فحثه شخصٌ + س) دەوترێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | شديدة مهموسة | [ج] | مجهورة رخـوة |
| [ب] | شديده مجهورة | [د] | مهموسة رخوة |

187- کام سیفەت دەنگ و هەناسە لە گەڵیاندا ڕێدەکات.

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | شديدة مجهورة | [ج] | شديدة مهموسة |
| [ب] | مهموسة رخوة | [د] | مجهورة رخوة |

188- بەرزترین پیتەکانی (الاستعلاء) پیتی:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ق | [ب] | ض | [ج] | ط | [د] | ظ |

189- نزمترین پیتەکانی (الاستعلاء) پیتی:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ظ | [ب] | خ | [ج] | غ | [د] | ق |

190- تەنها دوو پیت لە پیتەکانی (الإستعلاء) پەیوەندیان بە زمانەوە نیە.

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | غ، ق | [ب] | غ، ط | [ج] | ظ، ط | [د] | خ، غ |

191- نونی زەنەنەدارو تەنوین لە گەڵ چەند پیتی (الإستعلاء)دا ئاشکرا دەکرێن ؟

| [أ] | 2 | [ب] | 3 | [ج] | 5 | [د] | 7 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

192- نونی زەنەنەدارو تەنوین لە گەڵ چەند پیتی (الإستعلاء)دا دەشاررێنەوە؟

| [أ] | 2 | [ب] | 3 | [ج] | 5 | [د] | 7 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

193- پیتەکانی (الإستعلاء) ئەگەر ژێریان (کسرة) هەبوو دەکەونە پلەی ..........

| [أ] | چوارەمەوە | [ب] | سێیەمەوە | [ج] | پێنجەمەوە | [د] | دووەمەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

194- پیتی (خ) لە ﴿... وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّ ...﴾ یوسف 31، ئاستی قەڵەویەکەی لە پلەی .............. دایە.

| [أ] | یەکەم | [ب] | دووەم | [ج] | سێ یەم | [د] | چوارەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

195- ئەم ڕستەیە: ( ثبت عزٌ من يجوِّد حَرفهُ إذ سَلَّ شكا) پیتەکانی:

| [أ] | الرخاوة | [ب] | الشدة | [ج] | الاستفال | [د] | الانفتاح |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

196- بە پەنگخواردنەوەی دەنگ لە نێوان زمان و ئاسمانەی دەمدا دەوترێت:

| [أ] | الاستعلاء | [ب] | الإطباق | [ج] | الشدة | [د] | الجهر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

197- لاوازترین پیتەکانی (الإطباق ) کامەیە؟

| [أ] | ص | [ب] | ض | [ج] | ط | [د] | ظ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

198- بەهێزترین پیتەکانی (الاطباق) کامەیە؟

| [أ] | ص | [ب] | ض | [ج] | ط | [د] | ظ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

199- بەم پیتانە (من أخذ وجد سعة فزكا حق له شرب غيث) دەوترێت پیتەکانی:

| [أ] | الهمس | [ب] | الاستفال | [ج] | الانفتاح | [د] | الجهر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

200- (الحروف المستعلية المطبقة) بريتين له :

| [أ] | ص، ض | [ب] | ظ، ظ | [ج] | ق، ط، ص | [د] | ص، ض، ط، ظ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

201- به پیتەکانی (ق، غ ، خ) دەوترێت:

| [أ] | مستعلية مطبقة | [ج] | مستعلية منفتحة |
|---|---|---|---|
| [ب] | مستفلية مطبقة | [د] | مستفلية منفتحة |

202- به سیفەتی پیتەکانی (ص، ز، س) دەوترێت:

| [أ] | الهمس | [ب] | اللين | [ج] | التكرير | [د] | الصفير |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

203- بەهێزترین پیتەکانی (الصفير) پیتی (ص) چونکە ئەم سیفەتانەی تێدایە:

| [أ] | الإستعلاء والاطباق | [ج] | الشدة والجهر |
|---|---|---|---|
| [ب] | الإستعلاء والتفشي | [د] | الإطباق والجهر |

204- لاوازترین پیتەکانی (الصفير) پیتی (س)ـە کە ئەم دوو سیفەتەی تێدایە:

| [أ] | الإطباق والإستعلاء | [ج] | الإستعلاء والهمس |
|---|---|---|---|
| [ب] | الهمس والاستفال | [د] | الشدة والجهر |

205- ڕیزکردنی پیتەکانی (الصفير) له به هێزەوە بۆ لاواز:

| [أ] | ص، س، ز | [ب] | س، ص، ز | [ج] | ز، ص، س | [د] | ص، ز، س |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

206- کام کۆمەڵە پیت هەموو سیفەتەکانیان لاوازن؟

| [أ] | ث، ح، ف، هـ | [ج] | لن عمر |
|---|---|---|---|
| [ب] | ا، و، ي | [د] | (و، ي)ی لين |

207- ڕوونترین پیتی (قلقلة) کامەیە؟

| [أ] | ق | [ب] | د | [ج] | ط | [د] | ب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

208- پیتەکانی ( القلقلة ) لە کاتی دەربڕیندا

| | |
|---|---|
| [أ] | دەنگ و هەناسە لە گەڵیدا تێپەڕ دەبێت |
| [ب] | دەنگ تێپەڕ دەبێت و هەناسە تێپەڕ نابێت |
| [ج] | دەنگ دەگیرێت و هەناسە تێپەڕ دەبێت |
| [د] | نابێ دەنگ و هەناسە تێپەڕ بن |

209- وشەی ﴿ٱلۡعَبۡدُ﴾ کاتێك لە سەری بوەستی ..........

| | | | |
|---|---|---|---|
| [أ] | تەنها (قلقلة)ی بچووکی تێدایە | [ج] | (قلقلة)ی بچووک و گەورەی تێدایە |
| [ب] | تەنها (قلقلة)ی گەورەی تێدایە | [د] | دوو (قلقلة)ی بچووکی تێدایە |

210- گەورەترین (قلقلة) لە کام وشە دایە ؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ﴿مُحِيطٌ﴾ | [ب] | ﴿عَذَابٍ﴾ | [ج] | ﴿وَاقٍ﴾ | [د] | ﴿وَتَبَّ﴾ |

211- سیفەتی (الشدة)و (الجهر) لە پیتەکانی ...........دا هەیە؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | الصفير | [ب] | اللين | [ج] | القلقلة | [د] | الاستعلاء |

212- کام لەم وشانە درێژکردنەوەی (اللين)ی تێدا نیە؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ﴿قُرَيۡشٍ﴾ | [ب] | ﴿هُودٍ﴾ | [ج] | ﴿بَيۡعٌ﴾ | [د] | ﴿ٱلۡبَيۡتِ﴾ |

213- کام لەم وشانە درێژکردنەوەی (اللين)ی تێدایە؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | ﴿نَوۡمٌ﴾ | [ب] | ﴿نُوحٍ﴾ | [ج] | ﴿كَانُواْ﴾ | [د] | ﴿سُوٓءٍ﴾ |

214- پیتەکانی لادان (الإنحراف) چەندن؟

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | یەك | [ب] | دوو | [ج] | سێ | [د] | چوار |

215- پیتەکانی لادان (الإنحراف) بریتین لە:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [أ] | (س، ن) | [ب] | (ن، ل) | [ج] | (ل، ر) | [د] | ( ر، ج) |

216- لادانی کام پیت بۆ هەردوو لای پێشەوەی زمانە؟

| [أ] | ض | [ب] | ر | [ج] | ل | [د] | ن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

217- کام لەم پیتانە لادانی دەنگی بۆ ناوەڕاستی زمانە؟

| [أ] | ل | [ب] | ر | [ج] | ض | [د] | ج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

218- سیفەتی لادان (الإنحراف)؛

| [أ] | لە پیتی (ل) زیاترە لە پیتی (ر) | [ج] | هەردووکیان (لادانیان) وەك یەکە |
|---|---|---|---|
| [ب] | لە پیتی (ر) زیاتر لە پیتی (ل) | [د] | هیچیان (لادانیان) نیە |

219- سیفەتی لادان (الإنحراف) لەکام وشەدا لە هەموویان زیاترە ؟

| [أ] | ﴿فِرۡعَوۡنَ﴾ | [ب] | ﴿ٱلرِّجَالُ﴾ | [ج] | ﴿أَشۡتَرَىٰ﴾ | [د] | ﴿ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

220- سیفەتی (التفشي) تایبەتە بە پیتی:

| [أ] | ص | [ب] | س | [ج] | ش | [د] | خ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

221- کەمترین سیفەتی (التفشي) لە کام لەم وشانەدا هەیە؟

| [أ] | ﴿ٱلرُّشۡدُ﴾ | [ب] | ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ | [ج] | ﴿يَخۡشَىٰ﴾ | [د] | ﴿ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

222- دووبارەبوونەوە (التكرير ) تایبەتە بە پیتی:

| [أ] | ل | [ب] | ر | [ج] | ذ | [د] | ض |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

223- کام پیت سیفەتی (مامناوەندی) هەیە لە نێوان (الشدة)و (الرّخاوة)دا ؟

| [أ] | س | [ب] | ز | [ج] | ذ | [د] | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

224- سیفەتی (الاستطالة) تایبەتە بە پیتی

| [أ] | س | [ب] | ظ | [ج] | ض | [د] | ص |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

